زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ دەستووری خواستنێ



# ڕەوشتێ دەستووری خواستنێ

چیرۆک: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار



وەرگێڕان و ئامادەکرن:

دیان جەمیل

زنجیرا چیرۆکێن ئاڤاکرنا کەسایەتییا زارۆکی

# ڕەوشتێ دەستووری خواستنێ


چیرۆك: فید براکاش

وێنە: هارفندەر مانکار

وەرگێڕان و ئامادەکرن: دیان جەمیل

پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت



ژمارا سپاردنێ: 2182یا سالا 2016




# تەپا ئارامی

ئارام و ئالان هەردوو برایێن ئێك بوون، ئالان برایێ مەزن بوو و ئارام برایێ بچووك بوو. ڕۆژەكا هاڤینێ دەمێ دنیا یا هەتاڤ و گەرم و دەرگەهێن قوتابخانەیان ژی هاتبوونە گرتن، وان هەردووكان دناڤ باخچێ مال دا بۆ خوە یاریا تەپا پێ دكر.



ژ نیشکەکێ ڤە دەمێ ئالانی شوتەکا بهێز دانایە تەپێ، تەپا وان چوو دناڤ باخچێ جیرانێ وان بەهزادی دا. وان تەماشەی دیوارێ دناڤبەرا مالا خوە و یا وان دا کر گەلەك یێ بلند بوو.



ل وی دەمێ وان تەپە هاڤێتی یە دناڤ مالا جیرانێ خوە بەهزادی دا، ئەو مژوولی چاندنا هندەک گولان بوو دناڤ باخچەیی دا.



**ئالانى گازى كره جیرانێ خوه و گوتێ: چاوانى مام، زەحمەت نەبیت دێ شێى تەپا مە بۆ مە هاڤێژى ژبەركو ب شاشى ڤە مە شوتەكا بهێز بلند دانایێ.**



مامێ بەهزاد ب دلخۆشی ڤە تەپا وان بۆ هاڤێتە دناڤ باخچێ وان دا و کەیفا وان ژێ گەلەك ب ڤی چەندێ هات و بەردەوام بوون ل سەر یاریا خۆ.



**ل دووڤ دا جارەکا دی ئارامی شوتەکا بهێز دانایێ و ئەڤ جارە ژی هەر تەپە بلند بوو چوو دناڤ باخچێ جیرانێ وان دا.**

**ئارام نێزیکی دیوارێ مالا وان کر و گوتێ: مام بەهزاد کا تەپا مە بهاڤێژە دناڤ باخچێ مالا مەدا.**



لێ ڤێ جارێ ئەو مەندەهوش مان دەمێ مامێ بەهزاد تەپا وان بۆ نەزڤڕاندی. وان د دلێ خوە دا گوت: ئەرێ بوچی جارا وی تەپە زڤڕاند و ئەڤ جارە نەزڤڕاند.



ئەو ڕێکا ئارامی پێ داخوازا ڤەگەریاندنا تەپێ کری نەیا جوان بوو لەوڕا مامێ بەهزاد تۆڕە بوو و هزرکر ئارامی یێ ب بێمنەتی ڤێ داخوازێ ژێ دکەت.



ئالانی زانی کو مامێ بەهزاد ژبەر ڕەفتارا برایێ وی یا نەجوان یێ تۆڕەبوی لەوڕا گوتە برایێ خوە: ئارامی دڤێت تو نوکە بچی داخوازا لێبورینێ ژ جیرانێ مە بکەی.

ئارام چوو دەڤ مامێ بەهزاد و گوتێ: ببورە مام من ب شێوەیەکێ نەجوان داخوازا ڤەگەراندنا تەپا خوە کر، هیڤیدارم ل من ببورە و سوز بیت ئەز ڤێ ڕەفتارێ دوبارە نەکەم.



کەیفا مامێ بەهزاد ب ڤێ ئاخفتنا ئارامی و هات و دوبارە تەپا وی بو زڤڕاند و گوتێ: کورێ دڤێت تو ب ڕێزگرتن کەسێن مەزن باخڤی و دەمێ تشتەکێ ژێ داخواز دکەی بێژیێ "زەحمەت نەبیت" یان "بێ زەحمەت".



پشتی مامێ بەهزاد تەپا وان بۆ هاڤێتی، وان هەردووکان سوپاسیا وی کر و ڤێ جارێ ب شێوەیەکێ هێدی دەست ب یاریا خوە کر و شوتێن بهێز نەدانانە تەپێ.

## سەربوور

ئەگەر تو ب شێوەیەکێ جوان داخوازا هاریکاریێ ژ خەلکی بکەی دێ هاریکاریا تە کەن لێ هەکە تو ب بێمنەتی داخوازا تشتەکەی ژێ بکەی کەس داخوازا تە بجهت نائینیت.



# نێرگز و شەربەت

نێرگز و جوتیار خیشك و براییێن ئێك بوون، نێرگز ژ جوتیاری بچوكتر و كورتتر بوو لەوڕا نەدگەهشتە دولابێ كو شیر و شەربەت و فێقی تێدا هاتبونە هەلگرتن.

رۆژەكێ دەمێ ئەو هەردوو پێكڤە د ژورا لێنانگەهێ ڤە، نێرگزێ گوتە براییێ خوە: جوتیار كا بۆ من گلاسەكا شەربەتێ تێكە.



لێ برایێ وێ جوتیاری خوە بێدەنگ کر و هەست ب کێماسییێ کر دەمێ خویشکا وی یا ژ وی بچووکتر هوسا ب شێوازەکێ نەیێ جوان گوتییێ بۆ من شەربەتێ تێکە. لەورا وی بەرسڤا خویشکا خوە نەدا.



نێرگز مەندەهوش ما کا بوچی برایێ وی گلاسەکا شەرپەتێ بۆ تێنەکر، چونکی برایێ وی گەلەك حەز ژ وێ دکەت و هەموو گاڤا هاریکاریا وێ دکەت لێ ئەڤ جارە خوە بێدەنگ کر.



نێرگزێ ددلێ خوه دا گوت: تو بێژی من دلێ برایێ خوه هێلابیت هەتا ئەو هاریکاریا من نەکەت؟

پاشی هزرێن خوه کرن و هاتە بیرا وێ کو دڤێت ئەو ب شێوازەکێ جوان داخوازا ڤێ چەندێ ژ برایێ خوه بکەت لەورا دوباره گوتێ: برایێ من یێ خۆشتڤی جوتیار، دێ شێی بۆ من گلاسەکێ شەربەتێ تێکەی؟



کەیفا جوتیاری ب ڤێ چەندێ هات و هەر ئێکسەر ڕابوو ڤە و قالکا شەربەتێ ژ دولابێ ئینا دەر و گلاسەك بۆ خویشکا خوە تێکر. خویشکا ویژی گەلەك سوپاسیا وی کر و داخوازا لێبورینێ ژ وی کر دەمێ کو جارا ئێکێ نەجوان داخواز ژێکر.

## سەربور

ژبیرنەکە دەمێ تو داخوازا هاریکاریێ ژ کەسەکێ مەزن دکەی نابیت تو بێرێزی دگەل باخڤی بەلکو دڤێت بێژیێ "زەحمەت نەبیت دێ شێی هاریکاریا من کەی؟".



# پەرتووکا بەنازێ

بەناز زارۆکەکا بچووك و جوان بوو و گەلەك حەز ژ خواندنا پەرتووکان دکر. لێ ژبەرکو وێ پەرتووکەکا ب تنێ هەبوو لەوا وێ چەندین جاران ئەڤ پەرتووکە خواند بوو و یا ژێ بێزار بوو.

رۆژەکێ بەنازێ گوتە دایکا خوە: دادێ ئەز گەلەکا ژ ڤێ پەرتووکێ بێزار بوویم، من نوکە پەرتووکەکا دی یا چیروکان دڤێت.



دایکا بەنازی ب کارێ ناڤمالێ ڤە یا مژوول بوو و گەلەك یا واستیایی بوو لەوڕا گوتە کچا خوە:

بەناز ئەز نوکە ناگەهم بچمە بازاڕی و چ پەرتووکێن دی بۆتە بکرم چونکی ئەز گەلەك یا واستیایمە.



لێ بەنازێ چ پووتە نەدانا واستیانا دایکا خوە و جارەکا دی گوتێ: من ئەڤ پەرتووکا کەڤن نەڤێت چونکی ئەڤە چەندین جارا من چیروکێن وێ خواندن، من نوکە پەرتووکەکا نوو دڤێت.

هندی دایکا وێ هاتێ نەشیا وێ ڕازی بکەت.



دەمێ دایکا بەنازێ زانی کچا وێ ژ داخوازا خوە لێڤە نابیت گوتێ: کچا من، ئەز دێ نوکە قەهوەیەکێ چێکەم و ئەز و تو پێکڤە دێ ڤەخۆین و پاشی دێ پیپچەکێ بێهنا خوە ڤەدەم و چینە پەرتووکخانێ داکو بۆ تە پەرتووکەکا نوو بکرم.



پشتی قەهوە بەرهەڤ بووی، بەنازێ و دایکا خوە پێکڤە قەهوە ڤەخوار و تێر بێهنا خوە ڤەدان چونکی وی دەمی دایکا وێ ژی ژ کارێن نافماڵێ ب دوماهی هاتبوو.



**بەناز و دایکا خوە پێکڤە چوونە پەرتووکخانێ و پەرتووکەکا نوو بۆ وێ کری و دەمێ هاتینە مال دایکا وێ بۆ چیروك دخواندن و ئەو گەلەك ب ڤێ چەندێ یا کەیفخوش بوو.**

## سەربوور

دەمێ تو داخوازا هاریکاریێ ژ کەسەکی دکەی خوە هەکە تو بێژیێ "زەحمەت نەبیت" ژی، دڤێت تو بێهنا خوە فرەهـ بکەی هەتا ئەو هاریکاریا تە دکەت و زۆریێ لێ نەکەی

